# حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە



نوسینی: عەلی باپیر

١٤١٠ك - ١٩٩٠ز چاپی یەکەمی

١٤٢٦ - ٢٠٠٥ز چاپی دووەم

# حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لەڕوانگەی ئیسلامەوە

نوسینی: عەلی باپیر

١٤١٠ك - ١٩٩٠ ز چاپی یەکەمی

١٤٢٦ - ٢٠٠٥ چاپی دووەمی

ژمارەی سپاردنی (٤٣٣) ساڵی ٢٠٠٥ ی

وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ

# پێشەکی

الحمدلله رب العالمين ولي المؤمنين و ناصر المستضعفين وقاصم الجبارين ومذل المستكبرين، والصلاة والسلام على رسول الله محمد الصادق الامين وآله والطاهرين وصحبه الأعزة المجاهدين والتابعين لهم بأحسان الى يوم الدين.

خوێنەری بەڕێز: کە ماوەیەك پێش ئێستا لەلایەن ڕژێمی طاغوتی بەعسی عێراقەوە مەسەلەی لێبوردن (عفو) ڕاگەیەنراو، خەڵکی کۆچکەرو دەربەدەر کراو بانگ کرایەوە ژێر نیری کوفرو ستەمو فەساد، بە پێویستم نەزانی دەست بدەمە قەڵەمو هەڵوێستی خۆمان لەو بارەوە وەك (کوردێکی ئیسلامی) ڕوون بکەمەوە.

چونکە پێم وابوو کە لەلای هەموو کوردێکی مسوڵمان ئاشکراو بەڵگەنەویستە، کە مەسەلەی چوونە ناو دۆزەخی بەعسی ڕەگەزپەرستو چەوسێنەرەوەو بەکرێ گیراوو داشی دامەی دەستی کوفری جیهانیو، گەڕانەوە ژێر ڕکێفو قەمچیو پۆستاڵی جەندرمەو سیخوڕو جاشەکانی ئەو ڕژێمە طاغوتی‌یە دڕندەو خوانەناسە، شتێکی ناشەرعیو ڕەتکراوە (مرفوض) یەو بڕوام نەدەکرد هیچ کوردێکی خواناسو مسوڵمانو خۆ بەئوممەتی (محمد) زان، هەنگاوێکی وا بێ شەرعیو چەوت هەڵێنێ!!.

بەڵام چاوەڕوانیم دەکرد کە کەسانێکی وێڵو شوێن کەوتووی ڕێچکەو بیردۆزە هەڵەو لەبرەوکەوتوو و هەرەس هێناوەکان، کەپاش هەوڵو خەباتو شەونخوونیو کوێرەوەریو ئێشو ئازانی چەند ساڵە (گەیشتوونە بن بەست) و (دەستیان لەبنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچووە) و (بوونە سەپانی پووشێ) ڕەفتارو هەڵوێستێکی ئەوتۆیان لێ بپشکوێتەوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە کاتی خۆی برا گەورەو

چاوساغەکانیان وایان ئیخفالْ کردوون کەتاقە ڕێگای سەرفرازیو وەدەست هێنانی ئازادیو سەربەخۆیی تەنیا ئەو ڕێچکەو بیردۆزەیەیە کەئەوان گرتوویانەو، سەرکەوتنیشیان وەك (فەلسەفەی دیالەکتیکیو سۆشیالیزمی عیلمی) فەرموویانە: حەتمییەتیکی مێژوویی (حتمية تارخية) یە!!.

بەلاَم ئێستا بابای ئیخفالْ کراوو چەواشەکراو سەرنج دەدات نەك هەر ئامانجو ئاواتی ڕەوای ناوبراوی وەدەست نەهێناوە بگرە زۆر زۆریشی لەسەر قەرزدار بۆتەوە، پێشینان گوتەنی (ئیشەکەی بنەتووی خۆی نەکردۆتەوە) و (بەتەمای ڕیشی بووە، بەلاَم سمێڵیشی لەسەر داناون)!!.

بەڵێ بەزینو بێ هیواییو کول بوونی کەسانێکی گۆشکراو بەو جۆرە (فەلسەفە) و (بیردۆزە)انە، کەتەنیا (خۆ) دەبیننو لە (خوا) جل جلالە بێ هەواڵنو، هێندەش فەقیر حاڵن کە وادەزانن کەکارەکەیان بە (بسم الله) لێکردن تێك دەچێو[1]، هەتا لەخوا دووتر بن لەسەرکەوتن نیزیکترنو،

---

[1] لەگەشت (جولة) یێك دا کە لەمانگی (١٢)ی ساڵی (١٩٨٧) دا بەناوچەکانی پشدەرو مەرگەو جافەتیو سەرگەڵوو چۆخماخو زەرزیو گەورەدێ دا کردمان، لەیەکێك لەدێیە چارە ڕەشەکانی ئەو ناوچانەدا وەك عادەتی خۆمان لەپێشدا ڕوومان کردە مزگەوتی ئاواییو پاش گەسك لێدانیو پاککردنەوەی لەو تۆزو خۆڵو خشپو خاڵە کە بەهۆی پێڵاو دانەنانی میوانە نوێژنەکەرەکانییەوە کەوتبۆ سەر فەڕشو بەڕەکانی!!.
کاتی نوێژی شێوان (مغرب) هاتو بانگمان داو، خەڵکە داماوە کە بەسەرسووڕمانەوە بەرەو مزگەوت هاتنو، دوای نوێژ پێمان ڕاگەیاندن کە ئەگەر بتوانن حەز دەکەین بۆ نوێژی خەوتنان (عشاء)یش بێنەوە مزگەوتو هەندێك قسەتان بۆ بکەین.
بەڵێ سەرتان نەیەشێنم خەڵکەکە تێکڕا لەکاتو شوێنی دیاری کراودا، کۆبوونەوەو منیش چەند ئایەتێکم بۆ خوێندنو پاشان ئایەتەکانم بۆ تەفسیر کردنو چەند مەسەلەیەکم بۆ ڕوون کردنەوە. یەکێکیان کەناوی (سەید محەمەد) بوو بەدڵێکی گەرمو پڕ تاسەو چاوی ئەبڵەقەوە

هەتا پتر دژی دین بن زووتر بەرەو بەرزی دەچن! نەك هەر شتێکی سەیرو نامۆ نیە، بەڵکو زۆریش ئاسایی و چاوەڕوان کراوە، چونکە ئەوان وا حاڵی کراون کەبەردی بناغەی شۆڕش و خەباتی پێشکەوتووخوازانە ئەوەیە کە (خوا) و (غەیب و مەیب) نەهێنرێتە نێو حیساباتەوەو، بەس (خۆ) لەبەرچاو بگیرێ، ئنجا یاسایەکی خواییە کە هەر کەسێك و هەر گەل و کۆمەڵێك (خوا) فەرامۆش بکەن، (خوا)ش پشت گوێیان دەخات و ئیهمالیان دەکات و دەفەرموێ: (نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ)(التوبة: من الآية٦٧)، واتە: خوایان فەرامۆش کردووە، ئەویش فەرامۆشی کردوون..

بەڵام ئەوەی کە جێی سەرسوڕمان و پرسیارە، ئەوەیە کە کەسانێکی خواناس و مسوڵمان کە قورئان بە بەرنامەو پەیڕەویان و موحەممەد علیه الصلاه والسلام بە ڕابەرو پێشەوایان دەزانن[٢]، بەخۆیان ڕەوا ببینن کەدوای ئەوەی خوا

---

ڕووی تێکردمو گوتی: مامۆستا ئێمە زۆر خۆشحاڵین بەهاتنتان بەڵام پێم بڵێ ئێوە کێن و چین؟! چونکە تا ئێستا پێشمەرگەی وەك ئێوەمان نەدیوە!.

منیش وەڵامم دایەوەو خۆمانم پێ ناساندن، ئینجا گوتی جا باشتێکتان بۆ بگێڕمەوە، گوتم فەرموو: گوتی ڕەنگە هەتا ئێستا (٢٠٠) کۆبوونەوەمان زیاتر لەم مزگەوتەدا کردبن، بەڵام یەك جاریش (بسم الله) یان نەکردووە، تەنانەت جارێکی لەسەرەتای کۆبوونەوەوە گوتم دەی کاکە، (بسم الله الرحمن الرحیم) با دەست پێ بکەین! بەڵام (کادیر)ەکە بەتووڕەیی یەوە گوتی: ئەوە کێ بوو (بسم الله)ی کرد؟! منیش گوتم: من بووم بۆچی؟!.

گوتی: چونکە ئەو (بسم الله) کردنەیە کەئێمەی دووچاری ئەم چاڵە کردوەو، ئەو جۆرە بیرەیە کە نایەڵێ ئێمە ڕزگار بین، پێویستە بەس پشت بە (خۆمان) ببەستین و بەناوی خۆمانەوە دەست پێ بکەین، نەك بەناوی خوا!!

منیش پێم گوت: دەجا مادام کۆبوونەوەی ئێوە بەناوی خوا دەست پێ نەکات و، کاری ئێوە بە (بسم الله)ی کردن تێکبچێ، ئەوە من خوا حافیزو لەدانیشتنی وادا بەشداری ناکەم!!.

[٢] ئێمە ئیسلامەتی و مسوڵمانەتی لە جوغزی تەسکی بزووتنەوەی ئیسلامی‌دا کورت هەڵنایەنین، هەرچەندە هەندێك سینە پیس و داخ لەدڵانی پڕوپاگەندەچی بەدرۆو بوختان

وامان بۆ هەڵدەبەستن، بەڵکو بابای مسوڵمان لەهەر کۆڕو کۆمەڵێك دا بێتو سەر بەهەر حیزبو دەستەیەك بێت، مادام بۆ خۆی خۆی بەمسوڵمان بزانێو شتێکی وای تێدا نەبینرێ کەپێی لەئیسلام بچێتە دەرێو بەهەڵگەڕاوە (مرتد) لەقەڵەم بدرێ، وەك بەناڕاست دانانی یەك یاسای ئاشکرای ئیسلام واتە (إنكار ماعلم من الدين بالضرورة). ئەوە ئێمە هەر بەمسوڵمانی دادەنێین، هەرچەندە بڕواشمان وایە کەهەر مسوڵمانێك شوێن غەیری بەرنامەی خوا بکەوێ لەهەر کام لەلایەنەکانی ژیانیدا، ئەوە بەمسوڵمانێکی هەڵەو تاوانبار دادەنرێ، چونکە (إنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ)(آل عمران: من الآية١٩) کەواتە مەبەستمان لە وشەی (کەسانێکی مسوڵمانو خواناس) هەموو ئەوانەیە کەخۆیان بەمسوڵمان دەزانن‌و دژی کوفرو بێ بڕوایی (إلحاد) ن‌و، قسەو ڕەفتارێکی واشیان لێ نەپشکوتۆتەوە کە زانایانی ئیسلام بەکافرکەر (مکفرات) یان داناون‌و لە کتێبەکانی* (علم الكلام)دا ڕوون کراونەوە، با ئەو کەسانە لەبزووتنەوەی ئیسلامیش دا نەبن، چونکە ئێمە زۆر چاك دەزانین کە گەلی کوردی خواناس‌و مسوڵمان لەڕوی خۆشەویستی‌و بڕوا قەناعەت پێ بوونەوە وەدوای ئەو ڕێچکەو بیردۆزانە نەکەوتوە کەهەر لە فابریقەخانەی ئەو دەوڵەتە ئیمپریالیستانەوە هاتوون کە کاتی خۆی بەپێی پەیمانی (سایکس بیکۆ) نەخشەو پیلانی پارچە پارچە کردنی نیشتمانی ئیسلامی بەگشتی‌و نیشتمانی کوردیان** بەتایبەتی دانا، بەڵکو لەژێر تین‌و فشاری زوڵم‌و ستەم‌و بێ دەرەتانی‌داو، لەئەنجامی بێ شوانی‌و بێ کەسی‌دا دووچاری ئەو چۆرتە بووە!.

وە پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئێمە بەبێ ویژدانی دەزانین کە بەیەك چاو تەماشای ئەو حیزب‌و کۆمەڵانە بکرێ کە خۆیان بەنائیسلامی دەزانن، چونکە پێشینان گوتەنی (پەنجەی دەستانیش وەك یەك نین) و ، حیزب‌و دەستەیەك کەکەم‌و زۆر بڕوای بەئایین هەیەو دژی ڕەوشت نیەو هەڵوێستێکی ڕەسەنی نەتەوایەتی هەیەو، نامبەرەو بەری نەکردوە، زۆر جیاوازە لەپێڕو تاقمێك کە خاوەنەکەی لەسەر بناغەی بێ دینی بنیاتی ناوەو بڕوشی بەرەوشت (اخلاق) ی سمولمانانە نیەو بگرە هەوڵی نەهێشتنی داوەو دەدات‌و، هەر ڕۆژەش لەسەر ڕەتێك یاری دەکات‌و، هەر جارە دەست بەکونێکدا دەکات‌و، لەکوێوە بای چاکی بێت شەنەی خۆی دەکات، بێ ئەوەی گوێ بداتە ئایین‌و ڕەوشت‌و ژیان‌و قازانجی ئەو خەڵکە چاوڕاو لێکراوو لە خشتەبراوەی کەخۆی بەبرا گەورەو مشوورخۆرو فریادڕەسیان دەزانێ!!

---

*لەکتێبی (ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟!)دا تا ڕاددەیەك ئەو مەسەلەیە توێژراوەتەوەو ئەو سەرچاوانەش دەست نیشان کراون کەمەسەلەی ناوبراویان تێدا باسکراوە.

یارمەتی داون کۆچ بکەن و ئایین و ئابڕوویان لە جەنگالی بەدی طاغوت دەرباز بکەن، جارێکی دی وەك مەڕی بەدەم گورگەوە چوو بەپێی خۆیان بەرەو شەق و شێللاق و گۆپاڵ و پۆستاڵی بەعسی کافر بگەڕێنەوەو بەدەستی خۆیان پەتی لەسێدارەدرانیان بهۆننەوەو خۆ بفەوتێنن!!.

جا بۆیە لە کاتێکدا زانیم خەڵکێکی خۆبە مسوڵمان زان و بەحساب خواناس بەتەمای ڕۆیشتنەوەن و هەندێکیان دەستیشیان پێ کردووە، ئەمە لەلایەکەوە، وە لەلایەکی دیکەشەوە (بیان)ێکم بەدەست گەیشت کەلەرۆژی (٩/٣/١٩٩٠) دا بەناوی بزوتنەوەی ئیسلامیی‌یەوە دەرچووەو، دوو سێ قسەی زۆر بێ هێزو پێزو هەڵبزڕکاوانەی تێدان، بەپێویستم زانی لەدووتوێی نامیلکەیەك دا زۆر بەکورتی و گوشراوی هەڵوێسی ئیسلام سەبارەت بەو مەسەلەی گەڕانەوەو تەسلیم بوونەوەی ڕژێمی طاغوتی‌یە بخەمەڕوو ، مەسەلەی ناوبراو بەتەرازووی قورئانی بەپێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێز (علیة الصلاة والسلام) هەڵبسەنگێنین،، تاکو ئەوەی کەتا ئێستاش لەو مەسەلە روون و بەڵگەنەویستەدا، خوتخوتەیەکی لەدڵ دایە، خوتخوتەکەی نەمێنێ و بەرچاوی بەتەواوی ڕوون بێتەوەو، هیچ کەسیش قسەو بڕیارو هەڵوێستی کەسانێکی ناشێ لەسەر ئیسلام حیساب نەکات و هەموو خووڕڕەیەك بەئاوو هەموو چنراوێك بەجاو حیساب نەکات.

---

**بۆ زانینی چۆنیەتی زەوت کران و بەشرانەوەی نیشتمانی کورد، دەتوانی سەرنجی (سۆزی نەتەوایەتی) بدەی لاپەڕە (١٦٤) چاپی یەکەمەکەی.

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێز!

بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەی (حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت لەڕوانگەی ئیسلامەوە) پێویستە وەڵامی سێ پرسیاری گرنگ بدەینەوە:

یەکەم: بۆچی کۆچمان کردوە؟!

دووەم: بارودۆخی ئێستای عێراق چۆنە؟!

سێیەم: خواو پێغەمبەر ﷺ و مێژوی ئیسلام چ دەفەرموون؟!

جا خوا پشتیوان بێ ئێمە لەسێ باسی سەربەخۆدا وەڵامی هەرکام لەم سێ پرسیارە دەخەینەڕوو، پاشان ئەو ئەنجامگیری (استنتاج)یە بێ پێچ و پەناو مەنتیقی‌یەی کەوەك ئەنجامی هاوکێشەیەکی ماتماتیکی، لەپاش وەڵام درانەوەی ئەو سێ پرسیارە دەستگیر دەبێت لەژێر سەرباسێکی چوارەم و سەربەخۆدا بەناوی (گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت تاوانێکی یەکجار زلە) دەخەینەڕوو.

ئنجا باسێك بەناوی (چ جۆرە کەسانێك دەچنەوەو حوکمیان چۆنە؟!) دەخەینەڕوو.

وە لەکۆتایش دا باسێکی شەشەم بەناوی (گەڕانەوەی ئیسلامی یانە) دەنووسین.

ئێستاش بەپشتیوانی خوا دەچینە سەر وەڵامی پرسیاری یەکەم بەڵام دوای ئەوەی تۆزێك ماناو چەمکی وشەی (طاغوت) ڕوون دەکەینەوە:

(راغب الاصفهانی) دەربارەی وشەی (طاغوت) فەرموویەتی:[٣]

---

[٣] بروانە (مفردات ألفاظ القرآن) ص ٣٠٤، ٣٠٥.

(والطاغوت عبارة عن كل متعد وكل معبود من دون الله ويستعمل في الواحد والجمع.. ولما تقدم سمي الساحر والكاهن والمارد من الجن والصارف عن طريق الخير طاغوتاً..)

(ابن منظور)يش لەوبارەوە فەرموویەتی: [٤] (.. قال الليث الطاغوت تاؤها زائدة وهي مشتقة من طغي، وقال أبو اسحق: كل معبود من دون الله عز وجل جبت وطاغوت، وقيل الجبت والطاغوت الكهنة والشياطين.. وقال الاخفش الطاغوت يكون الاصنام والطاغوت يكون من الجن والانس.).

کەواتە: (طاغوت)یانی هەر شتێك کە لەگەڵ خوا یان لەجیاتی خوا دەپەرسترێ و فەرمانبەری و گوێ ڕایەڵی بۆ دەکرێ، جا چ بت و صەنەم بێت چ شەیتان بێت چ جند بێت چ مرۆڤ، وە لەڕاستیدا نیمچە ڕستەی (کل رأس في الضلال) هەموو سەرکردەیەك لەگومڕاییدا، چاکترین پێناسەو مەعنای پڕ بەپێستی وشەی گۆڕینە، مادام وابێ هەرکەسێك خۆی لە کۆمەڵێکی کەم یان زۆر بکاتە کوێخاو دەمڕاست و بەڕێی غەیری خواداو بەگوێرەی غەیری پەیڕەوی ئیسلام پێشیان بکەوێ، ئەو بە (طاغوت) لەقەڵەم دەدرێ، چونکە لەیاسا دەرچووەو لە بەرەی بەندایەتی لاقی تێپەڕاندووەو خۆی لەخەڵکی کردۆتە خواو فیرعەونانە [٥] بەزمانی حاڵ دەڵێ: (أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى)(النازعات: من الآية٢٤). واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم..

---

[٤] بڕوانە (لسان العرب) ج١٥ص١.

[٥] لەمەوە کەرابرد دەزانین کەبۆ بە (طاغوت) لەقەڵەم درانی ئینسان، هەبوونی دەسەڵات یان دام و دەزگایەکی دەوڵەتی بەمەرج نەگیراوە، بەڵکو زەبوونترین کەسیش مادام خۆی لەکۆمەڵێك کردە چاوساغ و دەمڕاست و بەرنامەڕێژی خەڵکەکەی لەبەرنامەی خوا لادا، بە طاغوت دادەنرێ چونکە خەڵکەکەی لەبەرنامەی خوا لادا، بەطاغوت دادەنرێ چونکە (رأس في الضلال)ە، وە هەر سەرکردەو پێشەوایەك ببێتە هەڵگری ئاڵای یەکێك یان زیاتر لە ڕێچکەو

# یەکەم

# بۆچی کۆچمان کردوە؟!

بێگومان دەگونجێ بەچەند جۆرێك وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، دەتوانین بڵێین:

(بۆئەوەی بەزەلیلی نەژین)، یان بڵێین: (بۆئەوەی لەدژی کوفرو زوڵم و فەساد خەبات بکەین)، یان بڵێین: (بۆئەوەی نەفس و ناموسمان دەرباز بکەین)، یان بڵێین: (بۆئەوەی خوا لێمان ڕازی بێ)، وە دەتوانین بڵێین: (بۆئەوەی بەرگری لەخەڵکی بێچارەمان بکەین)، یان بڵێین: (بۆئەوەی قەوارەو کیانێکی ڕاستەقینە بۆ گەلە چەوساوەکەمان دابین بکەین).. وە هەروەها.. هتد.

بەڵام ئەگەر بمانەوێ یەك وەڵامی کورتی کۆکەرەوەی وا بدەینەوە، کەهەموو ئەم وەڵامانەو چەندەهای دیکەش لەنێو خۆی بگرێ، دەبێ بڵێین:

---

بیردۆزە شەیتانی‌یەکان و بەو ناوەوە خەڵکەکەی چەواشە کردو فریودا، ئەوە هەر (طاغوت)ە با سەرۆکی دەوڵەتیش نەبێت.

بۆیەش ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیەم بەپێویست زانی، چونکە ئێستا لەنێو خەڵکی مسوڵماندا، وشەی ناوبراو زیاتر وەك پێناسەی سەرۆکە دەستەڵاتدارەکانی ئەو دەوڵەتانە بەکاردێ کە بەپێی ڕژێم و پەیڕەوێکی بەناو عیلمی یانەی نائیسلامی بەڕێوەدەچن، بەڵام بێگومان چەمك و واتای ناوبراو زیاتر زادەی عورفی نێو کۆمەڵگایە، دەنا لەئەسڵدا وشەی ناوبراو بەهەر کەسێك و هەر شتێك دەگوترێ کەدەبێتە هۆی لەخوا دوورخستنەوەو لەڕێی خوا لادانی خەڵکی مسوڵمان و، بەرەو گومڕایی و سەرگەردانی بردنیان و بەسەموو بردنیان.

(ئێمـەی کـوردی مسـولّمان بۆیـە کۆچمـان کـردوەو نیشـتمانمان بەجێهێشتووە تاکو چیدی لەنێو کۆمەڵگاو دەوڵەتێکدا نەژین کە بەپێی حوکمو بەرنامەی خوا بەڕێوە ناچێ و، بۆئەوەی بەپشتیوانی خوا بتوانین شۆڕش و جیهادێکی راستەقینە لەسەر بنچینەی ئیسلام بنیات بنێین، کە ئاواتی لەمێژینەی خەڵکی مسولّمانی عێراق بەگشتی و گەلی کوردی بێ مـاف بـە تایبـەتی بهێنێتــەدی، بـەهۆی بنیاتنـانی کۆمەڵگایـەك و دامەزراندنی دەوڵەتێکەوە کەبەپێی حوکمو بەرنامەی خوا بەڕێوەبچێ).

چونکە بێگومان هەموو ئـەو شـتانەی گوتـران و زیـاتریش بەرهـەمو دەستکەوتی بەڕێوەبەرانی حوکمو بەرنامـەی خـودان لـەزەوی داو، چـەند چاکەیەکن لەچاکەکانی دەوڵەتێکی راستەقینەی ئیسلامی.

بەڵام دەزانم کەلێرەدا، کەسانێکی لەئیسلام بێ هەواڵ و ناشارەزا دەڵێن:

جا خۆ کاکە ئێمە لەڕوی ئایین و ئیسلامەتی یەوە ناچەوسێنرێینەوە تاکو ئامـانجی کۆچکردنمـان شـۆڕش و خـەباتێکی ئیسـلامی یانە بێـت، بەڵکو ئێمە وەك (کورد) دەچەوسێنرێینەوە نەك وەك (مسولّمان)!!.

هەڵبەتە ئێمە نەدەبوو لێرەدا وەڵامـی ئـەم قسـەیە بدەینەوە، چونکـە پێشـتر بەرپـەرچمان داوەتـەوەو دەبـوو خوێنـەر حەواڵـەی ئـەو شـوێنە بکەین[٦]، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەم سەردەمەدا زۆر لەشوێنکەوتوو و لایەنگرانی حیزب و ڕێچکە نائیسلامی یەکان، قسەی گۆڕینیان کردۆتـە بنێشتە شینکەی سـەر زاریـان و تووتی یانـە دووبارەی دەکەنـەوە، وای

[٦] بڕوانە (سـۆزی نەتەوایـەتی) لاپـەڕە (١٧٢) ڕەواندنـەوەی تـەمۆژمی بۆچوونێکـی هەڵـە) چاپی یەکەمی...

بەچاك دەزانم وێڕای ئەو وەلامی پێشووەی کە ئیشارەتم بۆ کرد لێرەش دا شتێکی دەربارە بڵێم:

لەڕاستیدا ئەو کەسەی ئەم قسەیە دەکات وەك مەلای مەزبوورەی لێ هاتووە کەدەڵێن: ڕۆژێکی خەریکی بڕینەوەی درەختێك بوو، بەلام هەر هەمان لاخ (لق) کە لەسەری ڕاوەستا بوو بیورەکەشی لەوی دەداو، سەرەنجام هەر هێندەی زانی لەسەرڕا سەرەنگرێ بوو!! چونکە ئەو کەسەی کەدەڵێ: ئێمە وەك (کورد) دەچەوسێنرێینەوە نەك وەك (مسوڵمان)، وە لەڕووی نەتەوایەتی‌یەوە ستەممان لێ دەکرێ، نەك لەڕووی ئیسلامەتی یەوە، بەزمانی خۆی دانی پێدا دێنێ، کە ئەو کارەی ئەو پێی هەڵدەستێ‌و، ئەو ئامانج‌و مەسەبتەی ئەو ئاوبارەی هەوڵ‌و خەباتی بەرەو لا هەڵدەبەستێ، کارێکی بێ شەرعی‌و نامسوڵمانەتی‌یەو، لەبەرنامەو ئایینی خوادا بەڵگەی لەسەر نیە!!.

بەڵێ ئەو کەسە دان بەوەدا دێنێ کە (کوردایەتی)یەکەی لە (مسوڵمانەتی)یەکەی جیایەو، خەباتی (ڕزگاریخوازانە)ی کورد شتێکە (ئیسلامەتی) پشتگیری لێ ناکات‌و، بە مەبەست‌و ئامانجێکی ڕەوای حسێب ناکات!

بەلام نەخێر وا نیەو واقیعی (ئیسلامەتی) و (مسوڵمانەتی) پێچەوانەی ئەو جۆرە بیروبۆچوونە تەسك‌و خوارو خێچە فەقیرحالانەیە، چونکە ئیسلامەتی بەس بریتی نیە لەنوێژو ڕۆژوو و زیکرو دوعا، هەتا کە لە جوغزی ئەم بابەتە مەعنەوی‌و شەخسی‌یانە چووینەدەرێ، پێمان وابێ لەبازنەو جوغزی (ئیسلام)دا نەماوین، بەڵکو هەر هەمان ئیسلام کەنوێژو ڕۆژوو باقی درووشم‌و ئەرکە مەعنەوی‌و تاکی‌یەکانی لەسەر

پێویست کردووین، جەنگو خەباتی رزگاریخوازانەش لەسەر پێویست کردووین، وەك فەرموویەتی: (وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ..)(النساء: من الآية٧٥). واتە: ئەوە بۆ لەپێناوی خواو چەوساوان دا ناجەنگن..؟!

وە (مسوڵمانەتی) تەنیا بەوەندە پێك نایەت کە بابابەکی (نوێژکەر) بێ، بەڵکو وێڕای ئەمە، دەبێ خواناسێکی تێکۆشەرو (جەنگاوەر)یش بێ!.

ئەمە هەمووی لەلایەکەوەو، لەلایەکی دیکەوە زۆر جێی سەرسوڕمانە کەسێك واقیعی نائیسلامی یانەی کۆمەڵگای عێراقی بەگشتیو کوردەواری بەتایبەتی ببینێ کە لەسایەی شوومی حوکمی طاغوتییەوە پڕپڕ بووە لەکوفرو ستەمو بێدادیو چینایەتیو چەوساندنەوەو ڕەوشت نزمیو غەدرو خیانەتو خراپەکاریو.. هتد کەچی بڵێ: ئێمە وەك مسوڵمان ناچەوسێینەوە!! مەگەر هەرکامێك لەم دیاردەو خەسڵەتە پیسو بەدانە دژی ئیسلامو مسوڵمانەتی نینو، ئیسلام هەر بۆ ئەوە نەهاتوە کە بنەبڕو ڕیشەکێشیان بکاتو، لەجێی وان دا خواناسیو دادگەریو یەکسانیو ئاساییشو رەوشت بەرزیو بێ فەرقیو چاکیو چاکەکاریو.. هتد بچەسپێنێ؟!

بەڵێ ئیسلامەتیو مسوڵمانەتی بەس بریتی نیە لەنوێژو رۆژوو و زەکاتو حەجو زیکرو پاڕانەوە، هەرچەندە ئەمانە پایەو بنچینەو شتی گرنگو سەرەکی ئایینن، بەڵکو ئیسلام بەرنامەیەکە هەموو بوارو لایەنە ماددیو مەعنەویو تاکیو کۆمەڵایەتییەکانی ژیان دەگرێتەوەو، عیبادەتو سیاسەتو تەقواو غەزاو دواڕۆژو دنیاو مزگەوتو بازارو حەربو میحرابو شەونوێژو شەبەیخوون پێکەوە گرێ دەداتو هیچیان بۆ هیچیان فڕێ نادات، وە بەس کاتێکیش ئیسلامەتیو مسوڵمانەتی مەعناو مەبەستی پڕ بەپێستی

دیتەدی کە کۆمەڵگاو دەوڵەتێك بڕەخسێ هەموو ئەم لایەنانەی مل کەچی بەرنامەی خوا بن، دیارە لەحاڵێکی واش دا تەنانەت یەك تاقە ئینسانیش ناچەوسێنرێتەوەو بێ بەش نابێ، چ جای نەتەوەیەك!!

ئینجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ:

باشە تۆ چۆن دەتوانی بەناوی هەموو گەلی کوردەوە وەڵامی پرسیاری (بۆچی کۆچمان کردوە؟!) بدەیەوە، لەحاڵێك دا کەهیچ کام لەحیزب و کۆمەڵە نائیسلامی‌یەکان بەم وەڵامە قایل نین؟!

لەوەڵام دا دەڵێم:

لەڕاستی‌دا مەبەستم لەم وەڵامە ئەوەیە کەهەر کەسێك کوردێکی ڕەسەن‌و مسوڵمانێکی تەواو بێت، جگە لەوەڵامی ناوبراو هیچ قسەیەکی دیکە بەخۆی ڕەوا نابینێ، کەسانێکیش کەلەلایەنی (مسوڵمانەتی) یان (کوردایەتی) یانەوە کەم‌وکووڕی یان هەیە، ئەوە یان نابێ بڵێین: کورد نەتەوەیەکی مسوڵمانە، یان دەبێ بڵێین: ئەو جۆرە کەسانە ڕیزپەڕ (شاذ)ن‌و حیسابیان لەسەر ناکرێ، چونکە هیچ کاتێك یاسا (قانون) بەڕیزپەڕان هەڵناوەشێتەوە!!

(وردبوونەوەی دەوێ).

جائێستا کەزانیمان وەڵامی ڕاستەقینەی پرسیاری (بۆچی کۆچمان کردوە؟!) لەڕوانگەی ئیسلام‌و خەڵکی مسوڵمانی کوردەوە چییە؟ با بچینە سەر وەڵامی پرسیاری دووەم‌و بزانین داخوا ئەو ئامانج‌و مەبەستەی بۆی وەدەرکەوتووین تا چ ڕاددەیەك هاتۆتەدی، یان نەهاتۆتە دی، وە ئایا ئەو حاڵ‌و گوزەرانەی کەکاتی خۆی بەڕەوامان نەزانی تێیدا بمێنینەوە، ئێستا گۆڕانی بەسەردا هاتوەو لاچوە یان نا؟!

# دووەم

# بارودۆخی ئێستای عێراق چۆنە؟

خوێنەری بەڕێز!

ئەوەی ڕژێمی طاغوتی بەعس بەسەر گەلی کوردی مسوڵمان بەتایبەتی و، خەڵکی عێراقی بەگشتی هێناوە، نەك لەهیچ کوردێك بگرە لەزۆربەی گەلانی دیکەش شێرراوەو پەنهان نیەو، بەپێویستی نازانم کاتی خۆم و تۆش بەروونکردنەوەی شتی روونەوە بکوژم، ئنجا ئەوە کە ئایا بارودۆخی ئێستای عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی چۆنەو، هیچ گۆڕانی بەسەردا هاتوە یان نا؟! دیسان مەسەلەیەکی ئاشکرایەو حەوجێی بەتوێژینەوەو پشکنین و گەڕان و سووڕان ناکات، چونکە:

ئایا ئەو چەند هەزار گوندو دەیان شارو شارۆچکانەی کەلەماوەی ئەم دە یازدە ساڵەی دوایی‌دا وێران و خاپورو کراون و بوونە کەلاوەو، نزیکەی نیوەی رووبەر (مساحة)ی کوردستانی خوارووە دەگرنەوە، هیچیان ئاوەدان کراونەوەو کانی و کارێزو سەرچاوەو جۆگاو جۆبارو مزگەوت و حوجرەو قوتابخانەو پردو ڕێ و بان و ڕەزو باخ و کێڵگەو زەوییەکانیان چاك کراونەوە؟!

وە ئایا ئەو خەڵکە نەدارو بێ کارو کاسبی و دەست بەتاڵ و ڕوت و ڕەجاڵ و بێ ماڵ و حاڵەی کە بەتۆبزی لەئۆدرووگا زۆرەملی‌یەکان خزێنراون ڕێگایان پێ دراوە تەنانەت بەسەڵت و قولتیش بچنەوە سەر جێگاو ڕێگای خۆیان و، چیدی لەبن باری هەژاری و بێ کاری دا نەبن و، لەسۆنگەی بێ بژێوی‌یەوە دووچاری دەیان دەردو نەخۆشی کۆمەڵایەتی و خەسڵەت و ڕەفتاری بەدی وەك جاشەتی و سیخوڕی و ڕێگری و دووکان بڕی و سەردانەواندنی جۆراوجۆر نەبن؟!

وه ئایا ئەو کوفرو ستەمو بێدادیو ڕەگەزپەرستیو چینایەتیو سوودو بەرتیل خۆریو کوشتنو بڕینو داوێن پیسیو قومارو مەیخۆریو بێکارو دەست درێژیو ڕووتیو بەرهەڵدایی و بێ حەیاییو ترسو لەرزو دڵەڕاوکەو ژیانتاڵی بێ حاڵییەی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی بەعس ئەو خەڵکو جەماوەرە دەستەوستانو بێ دەرەتانەی پێوە گیرۆدە کردوە، هیچی لێ کەم بۆتەوە؟!

یان ئایا ئەو حەپس خانە تاریکو تەڵەو پیسانەی لە پیرو گەنج ئافرەتو پیاوو وردو درشتەکانی خەڵکی عێراق بەگشتیو گەلی کورد بەتایبەتی پڕکراون، ژمارەی دیلو گیراوەکانیانو، ئازارو ئەشکەنجە جۆراوجۆرەکانیان لێیان کەم کراوەتەوە، یان بەپێچەوانەوە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ هەر لە زیادبوونو پەرەستاندن (تطور) دان؟!

کەواتە: ئەوەی کەلەبەر واقیعو بارودۆخی تاڵو بێ حاڵو بێ ئامانی ڕژێمی خوانەناسو دیکتاتۆرو ڕەگەزپەرستی طاغوتو فیرعەونی عێراق خاکو ئاوو نیشتمانی خۆی بەجێ هێشتوە، با سوور بزانێ، کەئەو واقیعە تاڵو نائیسلامییە، هەتا ئێستاش هەر زیاتر بەرەو تاڵیو بێ دینی چووەو دەچێت، بەڵام ئەوەی کەکاتی خۆی هەروا بەگەشتو پیاسەو بۆ هەوای باڵ دانو دنیا دیتنو گەڕان پەرگەندە بووەو ملی ڕێیەی گرتوە، ئەوە دەتوانێ دوای وەدەست هێنانی ئاواتی بگەڕێتەوەو، بەرەو دۆزەخی بەعسو ژێر نیرو ئاموری طاغوت سەر شۆڕ بکاو سەرەو ژێر بێتەوە!!.

ئێستاش بۆ ئەوەی چاکتر مەسەلەی (حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە) ڕوونو ئاشکرا بێت، دەچینە سەر خاڵی سێیەمو وەڵامی پرسیاری:

(خواو پێغەمبەر ﷺ و مێژوو چ دەفەرموون؟!).

# سێیەم

# خوا جل جلاله و پێغەمبەر ﷺ و مێژووی ئیسلام چ دەفەرموون؟!

بەڵێ دوای خستنەڕوی خاڵی یەکەمو دووەم کە وەك ڕێ خۆشکردن بوون بۆ ئەم باسە با بزانین خوای کاربەجێو پەروەردگارو پێغەمبەری پێشەواو سەردارمان ﷺ لەو بارەوە چ دەفەرموون، وە با بزانین داخوا مێژووی پڕ شکۆی خواناسیو ئیسلامەتی لەو بارەوە چ هەواڵێکمان پێ دەدات؟!

أ-خوای بێ وێنە لەو بارەوە فەرموویەتی: (وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لا تُنْصَرُونَ) (هود:١١٣) واتە: وە – بەعاستەم – مەیل بەلای ئەوانەدا مەکەن کە ستەمیان کردوە دەنا ئاگرتان تووش دەبێت، وەجگە لەخوا هیچ پشتیوانێکتان نیە، ئنجا یارمەتیشتان نادرێ.

وەك دەبینین خوای دادگەر چوونە نێو ئاگری کردۆتە ئەنجامی یەك تۆز[٧] بەلاداچوونی ستەمکاران، بەڵکو ئەوانەی کەهەر یەك جار ستەمیان کردوە[٨] چ جای کەسانێك کەدەستیان هەتا ئانیشکان بەخوێنی چەوساوان سوورە!!.

---

[٧] چونکە توێژەرەوانی قورئان فەرموویانە: (الركون ادنى الميل) بڕوانە تەفسیری (فتح القدير) ج٢ص٥٣١، وە تەفسیری (الميزان) ج ١١ ص٥٦.

[٨] چونکە ئایەتەکە فەرموویەتی: (وَلا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا) نەك (.. إلى الظالين)!!.

دەجا دیارە بابایەك کە دەچێتە ژێر ڕکێفی ڕژێم نەك مەیلی کردوەو وە بەر حوکمی ئەم ئایەتە کەوتوە، بەڵکو یەکجاری خۆی دۆڕاندوەو خۆی بردۆتە ڕیزی ئەوانەوە کە لە دوارۆژدا پێیان دەگوترێ: (أين الظلمة وأعوان الظلمة) کوان ستەمکاران‌و دارو دەستەی ستەمکاران؟!.

(إبن حجر الهيتمي) فەرموویەتی: کابرایەکی بەرگدروو چوو بۆلای (سفيان الثوري) خوا لێی خۆش بێ، پێی گوت: قوربان من جل‌و بەرگی سوڵتان دەدوورم، ئایا لەڕیزی یارمەتی دەرانی زاڵمان (أعوان الظلة) دەژمێردرێم؟! (سفيان) فەرمووی: بەڵکو تۆ خۆت لەستەمکارانی، بەڵام یارمەتی دەرانی ستەمکاران (أعوان الظلمة) ئەوانەن کەدەرزی‌و دەزووەکەت پێ دەفرۆشن![9]

دیسان (إبن حجر) لە تەفسیرو لێکدانەوەی ئایەتی: (احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ ..)(الصافات: من الآية٢٢)، دا. فەرموویەتی: (و ازواجهم أي اشباههم واتباعهم) واتە: (ازواجهم) یانی: هاو وێنەکانیان‌و شوێن کەوتووەکانیان[10].

(زمخشري) یش لە تەفسیری ئایەتی (ولاتركنوا الى الذين ظلموا..) دا فەرموویەتی: (.. والنهي متناول للأنحطاط في هواهم، والانقطاع إليهم ومصاحبتهم ومجالستهم وزيارتهم ومداهنتهم، والرضا بأعمالهم، والتشبه بهم، والتزيي بزيهم، ومد العين الى زهرتهم، وذكرهم بما فيه تعظم لهم..)[11] واتە: وە قەدەغەکردنەکە هەموو ئەم شتانە دەگرێتەوە:

---

[9] بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج٢ص١٠٢.

[10] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە (٩٧).

[11] بڕوانە: (الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل) ج٢ص٦٢٣.

مل کەچ کردن بۆ ئارەزوویان، وە خۆ بەلادابڕینیان، وە برادەرایەتی کردنیان، وە لەگەڵ دانیشتنیان وە سەردانیان وەنەرمی لەگەڵ نواندنیان، وە ڕازی بوون بە کردەوەکانیان، وە خۆ وەك وان پێشاندان، وەپۆشینی جلو بەرگیان، وە چاوبڕینە زەرق و بەرقیان، وە باسکردنیان بەشێوەیەك کە بە گەورەگرتنیانی تێدا بێت.

دیسان (زمخشري) لەتەفسیرەکەیدا نووسیویەتی:

(وقد سئل سفيان عن ظالم اشرف على الهلاك في برية، هل يسقى شربه ماء؟ فقال لا، فقيل له: يموت؟ فقال: دعه يموت)[12] واتە:

وەپرسیار لە (سوفیان) کرا دەربارەی زۆردارێك کە لەچۆڵاییەکدا خەریکی مردنە، ئایا قومە ئاوێکی دەدرێتێ؟ فەرمووی: نە، پێی گوترا، ئەوی بمرێ؟! فەرمووی: لێی گەڕێ با بمرێ.

(قرطبي)یش لەتەفسیرەکەیدا لەتەفسیری ئایەتی (ولاتركنوا الى الذين ظلموا..) فەرموویەتی: (.. وانها دالة على هجران أهل الكفر والمعاصي من أهل البدع وغيرهم، فان صحبتهم كفر او معصية، إذ الصحبة لاتكون إلا من مودة وقد قال حكيم):

عن المرء لاتسأل وسل عن قرينه

فكل قرين بالمقارن يقتدي[13]

واتە: .. وە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر پەیوەندی پچڕاندن لەگەڵ کافرو خراپەکاراندا لە بیدعەچیو غەیری وانیش، چونکە دۆستایەتی

---

[12] بڕوانە: (الكشاف عن حقائق غوامض التنزيل) ج٢ص٤٣٤.

[13] بڕوانە (الجامع لاحكام القرآن) ج٩ص١٠٨.

کردنیان یان کوفره یان گوناحه، لەبەرئەوەی کە برادەرایەتی هەر بەرهەمی خۆشویستنە..

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

وەك دەبینین لەڕوانگەی قورئانەوە نیزیك بوونەوە لەکافرو زۆرداران تەنانەت[14] ئەگەر لەشێوەی دەرزی دەزو پێ فرۆشتن و سەرلێدان و لەگەڵ دانیشتن و لاساکردنەوەو چاولێکردن لەبەرگ و پۆشاك داو بەچاکە باسکردنیشدا بێت حەرام و قەدەغەیەو یان کوفرە یان لانی کەم گوناح و تاوانێکی گەورەو بێڕەزایە..

ئێستاش کەتۆزێك بەدرێژی ئەم مەسەلەیەمان لە ڕوانگەی قورئانەوە توێژیەوە، هەروا بەکورتی و بەخێرایی لەڕوانگەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و مێژووشەوە چاوێکی پێدا دەخشێنین:

ب- پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن، هەندێکیان لێ دەخەینەڕوو:

---

[14] کەواتە دەبێ ئەگەر ئەو نیزیك بوونەوەیە لە شێوەی سیخوڕی و جاسووسی و جاشەتی و سەربازی بۆکردن دا بێت، سزاو جەزرەبەکەی چۆن بێت؟

(مکحول الدمشقي) کە یەکێکە لەگەورەترین زانایانی ئیسلام لەو بارەوە فەرموویەتی:

(ینادي مناد یوم القیامة أین الظلمة واعوانهم فما یبقی أحد حبر لهم دواه و بری لهم قلما فما فوق ذلك إلا حضر معهم فیجمعون في تابوت من نار فیلقون في جهنم).

واتە: لەڕۆژی دواییدا بانگ کەرێك بانگ دەکات: کوان ستەمکاران و هاوکارانی ستەمکاران؟! جا هیچ کەسێك نامێنێ لەوانەی کە مەرەکەبی بۆ گرتبنەوەو یا قەڵەمی بۆ تیژ کردبن، یا بەکەمتر لەوەش هاوکاری کردبن، کە لەگەڵیان ئامادە نەبن و پاشان لەتابوتێکدا خڕ دەکرێنەوەو فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە.

بڕوانە (الزواجر..) ج٢ص١٠٢.

١-(من تشبه بقوم فهو منهم) رواه احمد وابوداود والطبراني وصححه العراقي وابن حبان. واته: هەرکەسێك بچێته سەر شێوەی کۆمەڵێك ئەوە لەوانە.

٢-(من كثر سواد قوم فهو منهم) رواه أبو يعلي والديلمي.

واته: هەرکەسێك ئاپۆڕایی کۆمەڵێك زۆر بکات لەوانە.

٣-(سيكون أمراء فسقة جورة فمن صدقهم بكذبهم وأعانهم على ظلمهم فليس مني ولست منه ولايرد على الحوض)[١٥] رواه النسائي والترمذي واحمد.

ج-مێژووشمان هەواڵمان پێ دەدات کە پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام و خواناسان بەدرێژایی مێژوو هەرکاتێك لەبەرخوا کۆچیان کردبێ و نیشتمانی خۆیانیان بەجێهێشتبێ، مەگەر خەڵکەکە چاك بووبێ و گەڕابنەوە، دەنا نەگەڕاونەوە مەگەر بەسەرکەوتنەوە، بۆ وێنە:

إبراهيم و لوط و يونس و موسى و أصحاب الكهف (عليهم الصلاة والسلام)..

هەڵبەتە ئەو دیاردەی کۆچکردن و نەگەڕانەوەیە بەبێ سەرکەوتن و دەستەڵاتی تەواوەوە بەجوانترین شێوە لەمێژووی ژیانی پێغەمبەری پێشەوامان دا ﷺ دەبینرێ.

خوێنەری بەڕێز! ئێستا کەزانیمان خواو پێغەمبەر ﷺ و مێژووی خواناسان بڕیاریان دەربارەی مەسەلەی ناوبراو چییە، کاتی ئەوە هاتوە کەبچینە سەر باسی چوارەم و بەڕاشکاوی و لەڕووی بەڵگەی پتەوەوە ڕای بگەیەنین کە:

---

[١٥] ئەم فەرموودەیە لەکتێبی (سۆزی نەتەوایەتی) چاپی یەکەمی لاپەرە (٣٩)دا لێك دراوەتەوە.

# چوارەم

## گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت تاوانێکی یەکجار زلە

لەڕاستیدا وەك لە (ڕێ خۆشکردن) دا گوتمان ئەم خاڵی چوارەمە ئەنجامو بەرهەمێکی مەنتیقیو سەلمێنراوی وەڵامی سێ پرسیارەکانی پێشەوەیە، چونکە:

مادام زانیمان ئامانجو مەبەستمان لە کۆچکردنو نیشتمان بەجێ هێشتن بووژاندنەوەی ئیسلامو هێنانەوەی حوکمی خوایە پێشی لە بەشە کوردستانی سەر بەعێراق داو ئنجا پێ بەپێ لەپشت بەستنی نیشتمانی ئیسلامو سەرتاسەری دنیادا، وە زانیمان کە بارودۆخی ئێستای کوردستانو عێراقیش بەگشتی ئەگەر لەوکاتەی کۆچمان تێدا کرد وێرانترو نائیسلامیتر نەبێت، چاکتر نیە، وە زانیشمان کەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕێگامان نادەن هەر بە عاستەمیش لەستەمکاران نیزیك ببینەوەو تەنانەت بەقسەی سەرزارەکیش پشتگیری یان لێ بکەینو، هەر بەڕواڵەتیش وەك وان بچینو، بگرە هەر بەنووسینیش ژمارەیان زۆر بکەین، چ جای لەگەڵیان بینو بەرگرییان لێ بکەینو هاوکارییان بکەینو خۆمانیان بۆ بەکوشت بدەین!!

بەڵێ ئێستا بەڕاشکاویو بێ پێچو پەنا، بوو بەشتێکی ئاشکراو سەلمێنراوو نکوڵی لێ نەکراو کە:

(گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لەڕوانگەی ئیسلامەوە) تاوانێکی یەکجار زلە.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە بچینە سەر خاڵی پێنجەمو بزانین داخوا ئەوانەی دەگەڕێنەوە ژێر ڕکێفی ڕژێم چ جۆرە کەسانێکنو حوکمیشیان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چییەو چۆنە؟!

# پێنجەم

# ئەوانەی دەچنەوە بن باڵی طاغوت کێن و چۆنن؟!

بەشێوەیەکی گشتی ئەو خەڵکەی دەچێتەوە بارەشی ڕژێمی طاغوتی لەعێراق دا دوو جۆرن:

أ-مسوڵمان   ب- نا مسوڵمان.

مسوڵمانەکانیش دوو جۆرن:

١-لەئیسلام حاڵێن بەڵام بڕوایەکی لەرزۆك و دانەمەزراویان هەیە.

٢-فەقیرحاڵ و ناحاڵێن و ئیسلام بەس لەجوغزێکی تەسك دا دەبینن و، نازانن کە ئەو خوایەی نوێژو ڕۆژووی لەسەر پێویست کردوون، هەر ئەویش لەستەمکاران نیزیك بوونەوەی لێ قەدەغەکردوون و، جەنگ و خەباتیشی لەسەر فەرزکردوون!

نامسوڵمانەکانیش دیسان دوو بەشن و هەردووکیشیان چارە ڕەش و سەر بەهەشن:

١-بەشێکیان لەسەرەتاوە بەدڵی خۆیان بۆ شۆڕش و خەبات و بەمەبەستی ڕزگاری خەڵك هاتبوون، بەڵام پاش دەست لەبنی هەمانەی بەتاڵی ڕێچکان دەرچوون و ڕەنج بەزایە چوون و بێ هیوا بوون، بڕوایان بەشۆڕش و خەبات نەماوەو سەر بەرەو ژێر بەرەو هەڵدێر بە ناچاری ملیان ناوەو، کەمێکیشیان هەر لەمێژە لەیەکێك لەوڵاتانی ڕۆژئاوای سەرمایەدارو بورژواو کۆنەپەرست و فاشیست دا جێ پێ، یان هێلانەی خۆیان و خێزانیان سازداوە!!.

٢-بەشەکەی دیشیان هەر لەڕۆژی بەرێوە بەنیازی شۆڕش و مۆڕش و خەڵك رزگارکردن نەهاتبوون، بەڵکو دینەمۆی وەگەڕخەرو دەماری بزوێنەریان خۆحەساندنەوە یان حەواندنەوەو، فیزو کەشخەکردن و گەدەو داوێن تێرکردن بووە، ئێستاش کەئەو مەبەستانەی بەدوایاندا وێڵ بووبوون، زەمینەی وەدەست خستنیان نەماوەو، ئەو درۆزناوەی تائێستا پاراویان لەبەر دەکردن چۆڕەبڕ بووەو تلپاتی تەڕی تێدا نەماوە، ناچارن بەهەمان مەبەستی پێشووەوە بەرەو هەوارو مەنزڵێکی دیکەی هەموارو لەبارو بەرهەمدار ملی ڕێیە بگرن و بگەڕێنەوە دواوە!!

گەواتە: ئەوانەی دەچنەوە نێو باوەشی گەرمی طاغوت سەرجەم چوار جۆرە کەسن:

١-مسوڵمانێکی بڕوا دانەمەزراوو زراوچوو و بەزیو.

٢-مسوڵمانێکی ناحاڵی و فەقیرحاڵ و نەپەڵتیو.

٣-نامسوڵمانێکی شەوە ڕەشگێڕی بێ هیواو بەبن بەست گەیشتوو.

٤-نامسوڵمانێکی ئارەزووخوازی تێر نەخواردووی هەوار لێ تێکچوو.

حوکمی هەرکام لەم چوار جۆرە گەڕاوانەش، لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئاوایە:

أ-جارێ بابای نامسوڵمان ئەوە بەدەردی پێشینان دەڵێن:

(بووکمان گەلێك جوان بوو خرۆێلکە (ئاوڵە)شی لێ هاتن)!.

ئەوانە سەرەڕای کوفرو بێ بڕوایی، تاوانی نزم و پەستی و زاڵم پەرستیشیان هاتۆتە سەرێ، بەڵام هەرچۆنێکی بێ (بێ هیوا بەبن بەست گەیشتوو)ەکە حاڵی چاکترە لە (ئارەزوو خوازە تێرنەخواردوو)ەکە، چونکە ئەوەی لەهەقێ دەگەڕێ و ناییێکێ، وەك ئەوە نیە کەبەرەو باتڵ

دەڕاو دەشی پێکێ (یەکەمیان ڕێی تێدەچێ - ئەگەر بەردەوام بێ لەسەر گەڕان - ڕۆژێك لەڕۆژان بەمراد بگا، بەڵام دووەم زۆر دوورە.

٢-بابای مسوڵمانیش، ئەوەیان کە ناحاڵی و نەگووڕاوە، زۆر چاکترە لەوەی بەزیوو بڕوا دانەمەزراوە، چونکە ئەگەر بابای ناحاڵی بڕوبەهانەیەکی لە بێ ئاگایی و نەزانی لەدەست دایە، کابرای زۆرزان ڕێگای لامو جیمی لێ گیراوە، هەڵبەتە هەردووکیشیان بەچەندان دەقی قورئانو سوننەت دەوریان گیراوە، وەك : (أتأمُرُونَ النَّاسَ بالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ وَأَنْتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلا تَعْقِلُونَ) (البقرة:٤٤).

وە (فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ)(النحل: من الآية٤٣).

وە (لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ، كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ) (الصف:٢-٣).

وە (وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ) (القمر:١٧).

کۆتایی ئەم باسە بەم ئایەتە پڕ هەڕەشەیە دێنین کە دەفەرموێ:

(إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيراً) (النساء:٩٧).

واتە: بێگومان ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان کێشان لەحاڵێك دا کەستەمیان لەخۆیان کردبوو - بەهۆی کۆچ نەکردنەوە- پێیان گوتن: لەچی دابوون؟ - بۆچی لەژێر نیری طاغوتدا مانەوە؟؟ - گوتیان ئێمە چەوسێنراوە بووین لەزەوی‌دا - و توانای ڕاکردنمان نەبوو - (فریشتەکان) گوتیان: ئەدی زەوی خوا فراون نەبوو کە کۆچتان تێدا کردبا؟؟! جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخەو خراپترین سەرەنجامیش ئەوێ یە.

ئێستاش دەچینە سەر خاڵی شەشەمو کۆتایی:

# شەشەم

# گەڕانەوەی ئیسلامی‌یانە

خوێنەری بەڕێز!

خوا پشتیوان بێ لەم خاڵەدا کە باسی کۆتایی ئەم نامیلکەیەیە، باسی چۆنیەتی و شێوەی گەڕانەوەی ئیسلامی‌یانە بەرەو وڵات و نیشتمان دەکەین.

پێشەکی دەڵێم:

مەبەست لەگەڕانەوەی ئیسلامی‌یانە، ئەو شێوە بەرەو نیشتمان گەڕانەوەیە کە لە ئیسلامدا بەشتێکی شەرعی و ڕەوا دانراوە. کەواتە با بزانین داخوا ئیسلام چ جۆرە گەڕانەوەیەك بەڕەواو شەرعی دادەنێ؟!

دەتوانین لەدوو خاڵاندا وەڵامی پرسیاری پێشوو بخەینەڕوو:

یەکەم: ئیسلام تەنیا کاتێك بەشوێن کەوتووانی کۆچکردوی ڕەوا دەبینێ کە بگەڕێنەوە سەر جێ و ڕێ و نیشتمانی ئازیزیان کە ئەو ئامانج و مەبەستە بەرزو پیرۆزەی لەسەرەتاوە بۆ وەدەست هێنانی دەست بەرداری خزم و خوێش و خاك و ئاویان بوو ون، دەستگیری بکەن، کە بریتیە لەگۆڕین و چاککردنی کۆمەڵ و لابردنی کوفرو ستەم و فەسادو، چەسپاندنی بڕواو دادگەری و چاکە، لەڕێی بنیات نانی کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامیِ ڕاستەقینە.

ئەگەرنا بەهیچ شێوەیەك بۆی نیە بگەڕێتەوە نێو کۆمەڵگایەك کە ناتوانێ خوای تێدا بپەرستێ، هەروەك چۆن بۆی نیە خۆی بخاتەوە نێو

گـرو مەشـخەڵی ئـاگرێك كـەلێی قوتـار بـووە، وەك پێغەمبـەرمان ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

(ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان: أن يكون الله ورسوله أحب اليـه ممـا سواهما، وأن يحب المرء لايحبه الا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد اذ انقذه الله منه، كما يكره أن يلقى في النار) رواه البخاري ومسلم واحمد والنسائي والترمذي وابن ماجة.

واتە: هەركەسێك سێ خەسڵەتی تێدا بێ شیرینایەتی بڕوای دەست كەوتوە: كەخواو پێغەمبەرەكەی ﷺ لەغەیری وان لـەلا خۆشەویست تـر بن، وە كە ئینسانێكی خۆشویست بەس لەبەر خـوا خۆشـی بـوێ، وە كەپێی ناخۆش بی بگەڕێتەوە نێو كوفر دوای ئەوەی خـوا لێـی قوتـار كردوە؛ هەروەك چۆن پێی ناخۆشە فرێ بدرێتە نێو ئاگرەوە.

دووەم: بێگومان ئێمە خۆمان بە ئۆممەت و كۆمەڵ (جماعة)ی پێغەمبەر ﷺ لەقەڵەم دەدەیـن، دیـارە ئـەو زاتـە بـەرزەش رووحـم بـەقوربانی رێ و شوێنەكەی بێت، خوا گێڕاویەتی بە ڕابەرو چاوساغ و سەرمەشقی ئێمە وەك فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَـنْ كَـانَ يَرْجُـو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ (الأحزاب:٢١).

واتـە: بێگومـان لەپێغەمبەری خـوادا بۆ ئێوە سەرمەشقی‌یەكی چاك هەیـە، بۆ هـەركامێكتان كـە بـەئومێدی -دیـداری- خـواو - پاداشـتی- دوارۆژەو زۆریش یادی خوا دەكات.

جا دیارە كە ئەو سەرمەشقی و پێشڕەوایەتی‌یەی پێغەمبەریشمان ﷺ تایبـەت نیـە بەلایـەنێك و دووانـەوە، بـەڵكو گشـتی و هەمەلایەنەیـەو، پێویستە ئێمە لەهەموو وردو درشتی ژیان و هەڵسوكەوتەكانماندا ئـەو

پێشەوا رەندو سەرکردە رەوشت پەسەندە بکەینە سەرمەشق و جێی سەرنج و چاولێکردنمان، دەجا شتێکی ئاشکرایە کە پێغەمبەرمان ﷺ دوای ئەوەی بەفەرمانی خوا کۆمەڵگای پڕ کوفر ستەمو خراپەی مەککەی بەجێ هێشتو ماڵ ئاوایی لەو نیشتمانە ئازیزەی کرد کە لە هەموو شوێنێکی دیکەی خۆشتر دەویست[١٦]، بەڵام خواو ئیسلامی لەوی لەلا خۆشەویست تر بوو، دەستی بە شۆڕش و خەباتی بێ وچان و خۆڕاگرانەی فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و چەکدارانە کردو، تەنیا[١٧] کاتێك گەڕایەوە ئەو شارە پیرۆزە کە سرودی (الحمدلله وحده، نصر عبده، واعز جنده، وهزم الأحزاب وحده)ی بەسەر زاراوە بوو!

گەواتە: ئێمەش کەخۆمان بەکۆمەڵ و شوێنکەوتووی ئەو پێغەمبەرە بەرزە دەزانین، پێویستە بەشوێن پێی ویدا هەنگاو بنێین و، هەڵوێست و ڕەفتارە ئیسلامییە بەرزەکانی وی بکەینە سەرمەشق و جێی سەرنج و تێوەرامانمان.

دەجا خوا پشت و پەنامان بێت ئێمەش لەسەر خەبات و کارکردنی ئیسلامییانەمان بەردەوام دەبین و، بێ پسانەوە دەست بەکاردەبین، هەتا خوا بەلوتف و بەزەیی خۆی لە ئەنجامی خۆگۆڕین و چاککردن و زەبری

---

[١٦] وەك بۆ خۆی لەوبارەوە فەرموویەتی: (ما أطيبك من بلد وأحبك إلي، لولا أن قومي اخرجوني فيك ماسكنت غيرك) رواه الترمذي عن ابن عباس.
بۆ ماناو مەبەستی ئەم فەرموودەیەش سەرنجی کتێبی (سۆزی نەتەوایەتی)بدە، لاپەڕە (٦٦) چاپی یەکەم.

[١٧] بێگومان لەساڵی (٦ و ٧) ی کۆچیدا بە مەبەستی حەج و عەمرە بەرەو مەککە گەڕایەوە، نەك بۆ نیشتەجێ بوون و مانەوە، کە ئەوە بوو لەساڵی شەشەم دا ڕێی لێگیراو لەساڵی حەوتەم دا چوونە مەککەو عەمرەیان کرد.

گرچووبڕو زراو ڕژێن لەدوژمن وەشاندن، دەرووی خێرمان لێ دەکاتەوەو، واقیعی ژیانمان بۆ دەگۆڕێ، وەك فەرموویەتی:

(إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ )(الرعد: من الآية١١).

ئەوانەش کەگومانیان وایە تازە لەکوردستاندا ناگونجێ خەباتی چەکدارانە بکرێ، لەدوو حاڵ بەدەر نین یان نا مسوڵمانی بەس پشت بەخۆ بەستووی دەستی خوا نەدیوی تەپیوو بەزیون، یان مسوڵمانی بڕوا دانەمەزراوو دڵ بەتاڵو نەپەڵتیون.

ئەم مەسەلەیەش حەوجێی بەڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی زۆر دەکاتو، گەلێك پەراوێزی جۆراوجۆری لەسەر هەڵدەستن بەڵام لێرەدا دەرفەت نیەو، خوا پشتیوان بێ بەتەمام لەداهاتوویەکی نیزیکدا نووسراوێك دەربارەی:

(هۆی سەرنەکەوتنو هەرەس هێنانی شۆڕشو جووڵانەوەکانی کوردو، ڕێگای چارەسەر) بنووسمو، لەوێدا مەسەلەی ناوبراوو گەلێك باسو بابەتی دیکەش دەتوێژرێنەوەو، لەمەحەکی عەقڵو شەرع دەدرێنو هەڵدەسەنگێنرێن.

## لەکۆتاییدا

ئەوەی دەمەوێ لەکۆتایی ئەم برە توێژینەوەیەدا دەربارەی مەسەلەی (چوونەوەو نەچوونەوە ژێر نیری طاغوت) بیخەمەڕوو، دوو شتن:

**یەکەم:**

گەلی کوردی هەر چوار پارچە بەشکراوەکانی کوردستانی داگیرکراو، گەلێکی خواناسو مسوڵمانەو، جگە لەئیسلام بەهیچ شتێکی دیکە ڕازی

نەبووەو نابێ، کە جاروباریش بەشێك لەو گەلە ستەمدیدەو بێ شوانە پەنای بردۆتە بەر چەند ڕێچکەو بیردۆزەیەکی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی، ئەوە ناگەیەنێ کەئەو گەلە مسولمانە لەئیسلام پاشگەزبۆتەوەو چۆتە سەر ئایین و بەرنامەیەکی دیکە، بەلکو یەکەم لەڕووی ناچاری و تێگیراوی و دەست لەپچکان براوییەوەو، دووەم بەهۆی نەزانی و بێ ئاگایی و شارەزا نەبوونی وەك پێویست بەتێرو تەواوی هەمە لایەنەیی بەرنامەکەیەوە - کەئیسلامە -و سێیەم لەسۆنگەی کەمتەرخەمی و دەباران دا نەبوون و نەزانین و نەتوانینی ئەو مەلاو خوێندەوارو ڕۆشنبیرە ئیسلامییانەوە، کە خەلك بەشوان و چاوساغی خۆیانیان لەقەلەم داون، دووچاری چۆرتمی گۆرین بووەو، لەتەلەو داوی ڕێچکان کەوتوە[١٨].

وە لەڕاستیدا پەندی (لەگۆلکی ڕەوییەوەو* بەسەر بەرازێ دا کەوت) لەگەلی کوردمان رووی داوە، چونکە لەکەس شاراوە نیە کە ئەو ڕێچکەو بیردۆزانە بۆ گەلی کوردو نیشتمانەکەی وەك ئەو بایەقووش (کوندەپەپوو)ە بوون کە خەلکی عەوام دەلێن: لەهەر جێیەکی بخوێنێ دەبێتە کەلاوەو وێران دەبێت[١٩].

دووەم:

کەواتە ئەگەر هەتا ئێستا لەبەر هەر هۆیەك بووە خۆمان گیرۆدەی داوی ڕێچکان کردوەو، لەئەنجامی ئەوەش دا هەم خۆمان - وەك

---

[١٨] ئەو مەسەلەیە تارادەیەکی چاك لەنامیلکەی: (کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!) دا توێژراوەتەوە.

* ڕەوییەوە: سلەمییەوە.

[١٩] سەرنجی هەمان سەرچاوەی پێشوو بدە.

شـــۆڕش- گـــەندەڵ کـــردوەو هـــەم زۆربـــەی گەلەکـــەمانمان ناچـــاری دوورەپـــەرێزی کـــردوەو هـــەم خـــەڵکمان لـــەخۆمان و گەلەکـــەمان دڕدۆنـــگ کردوەو، هەم خوامان لەخۆمان ڕەنجاندوە، با لەمەودوا ڕاستە شەقامی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بگرین و، وەك پێویست بەئیسلامەوە پابەند بین، بۆئەوەی لەپێشـەوە حـاڵ و وەزعـی خۆمـان و گەلەکـەمان بگـۆڕیـن و چـاك بکەین و، لەئەنجامی ئەوەشدا خـوا لـەخۆمان ڕازی بکـەین، بێگومان هـەر گەل و کۆمەڵێکیش خوا لێیان ڕازی بێ و خۆشی بوێن پشتیان دەگرێ و لەسـەریان دەکاتـەوە، مسـۆگەر مسـۆگەریش بـێن هـەر گـەل و کۆمـەڵێك - هەرچەندە زۆر کەمیش بن - خوایان لەگەڵ بێ و لەسەریان بکاتـەوە هیچ هێزێك دەرِۆستیان نایەت و خۆیان بۆ ڕاناگرێ.

ئیـدی بـەئومێدی لەگـەڵ خـوا ئاشـت بوونـەوەو، لەئیسـلام نـیزیك بوونەوەو، تاقە ڕێی چارەسەر دێننەوە.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ، وَالَّذِيـنَ كَفَـرُوا فَتَعْسـاً لَهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ).

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

٨ شوال ١٤١٠

خدراوا

بەشە کوردستانی سەر بەئێران

# بانگەوازێك بۆ گەلی كوردی بریندارو بەئازار

بسم الله الرحمن الرحیم

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ.. ..)

(لأنفال: من الآية٢٤)

ئەی گەلی كوردی خۆشەویست!

لەكەسمان پەنهان نیە كە بە چ قۆناغێكی سەختو دژوارو بارودۆخێكی ناسكو بەئێشو دژواردا تێدەپەڕین!

بەلام بەدەردی پێشینانمان فەرموویانە: (چ ئەلەم بێ قەلەم نین)![٢٠]

جا هەرچەندە لەپەیدابوونی ئەم بارودۆخو واقیعە پڕ ئێشو ژانەمان دا زۆر لایەن دەستیان هەیە، هەر لە ئیمپریالیزمی جیهانخۆری سوورو رەشەوە بیگرە هەتا رژێمە رەگەزپەرستو شۆڤێنیی‌یە ناوچەیی‌یەكانی گەلانی دەوروبەرمانو، تەنانەت جەماوەرو كۆمەڵو بزووتنەوە ساردو سڕو كەمتەرخەمە مسوڵمانەكانی (جیهانی ئیسلامی)یش!! بەلام گومانی تێدا نیە كە بۆ خۆشمان بێ خەتا نینو، بەڵكو ئەگەر بەوردیو بێ لایەنیو بابەتی‌یانە سەرنج بدەین، دەزانین كە بۆ خۆمان پشكو بەشی هەرە گەورەمان لەرەخسانی ئەم واقیعە دژوارو پڕ ئازارەی خۆمان دا هەیە[٢١]. خواش فەرموویەتی: (أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ.. ..)(آل عمران: من الآية١٦٥).

---

[٢٠] ئەلەم: ئازار. قەلەم: درك، چقڵ.

[٢١] لەنامیلكەی (كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!) دا ئەم باسە تونژراوەتەوە.

دەجا جەماوەری بێ پشتیوان و مافخوراوی کوردی مسوڵمان! وەرن با هەموومان وێکڕا یەکدڵ و یەك دەست دەست لەڕێسمانی خوای پەروەردگارمان بگرین، کە تاقە پشت و پەنای ڕاستەقینەمانە، وە باچیدی بەهۆی شوێن کەوتنی ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤکردە خەیاڵی یەکانەوە خۆمان دەسخەڕۆ نەکەین و، نەکەوینە دوای کڵاوی بابردوو!.

بەسە با چیدی ئارەق و خوێن و وزەو تینمان لەگونیەی بن دڕاوو هەگبەو گیرفانی ڕێچکەی خوارو سەرکردەی بێ بار نەکەین!.؟

با بەدەم بانگەوازی خوای میهرەبانمانەوە بچین کەدەفەرموێ: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە ﷺ، کەبانگیان کردن بۆلای بەرنامەیەك کە زیندووتان دەکاتەوە..)

هەڵبەتە ئەی جەماوەری کوردی مسوڵمان! دەزانین کە لە چ تەنگدەستی و نەداری و بێ حاڵی یەکدا دەیساچێنین، بەلام نابێ ئەم وەزعە ناهەموارە چۆکمان پێ دابدات و کۆڵمان پێ بدات، .چونکە وەك گوتراوە:

یقدر الکد تکتسب المعالی من طلب العلی سهر اللیالی

بەڵێ هەر گەل و کۆمەڵێك بیەوێ لەبن باری مەینەتی و ژینتاڵی بێتە دەرێ و بە پەیژەی ئازادی و سەربەستی دا بچێتە سەرێ، حەتمەن دەبێ ئازارو ئێش و نارەحەتی و کوێرەوەری لەخۆی بگرێ.

جا بێگومان ئێمەی کورد زۆرمان ئازار چێشت و زۆرمان دەردەسەری لەخۆگرت بەلام چونکە لەڕێی سروشتی یەوە بەرەو ئامانج نەچووین، کە ڕاستە شەقامی خوایە هیچمان بەهیچ نەکرد، بگرە زۆریشمان زەرەر کرد.

بەڵام بەهەرحاڵ سوار هەتا نەگلێ نابێتە سوارو، هەر عەقڵە لەخەسارێك، با پەند لەڕابردوو وەربگرین‌و، ئەمجارە ڕاستەڕێی ئیسلام بەرەو ئامانج‌و مەبەستی شەرعی‌و ڕەوامان بگرین.

هەڵبەتە ئێمەش وەك كەسانێكی ئیسلامی پەیمانمان بەخوا داوەو، گفت‌و بەڵێنیش بەگەلی مسوڵمانمان دەدەین، كە بەپێی خەت‌و ڕێبازی پێغەمبەرمان ﷺ لەسەر خەبات‌و تێكۆشانی ڕەوامان بەردەوام بین‌و، لەهەموو ئێش‌و ژان‌و هەورازو نشێوو تاڵی‌و شیرینی‌یەكدا كە دێتە ڕێی خەڵكی خواناسمان – خوا پشتیوان بێ – بەشداربین‌و، هەتا نانێكمان هەبێ پێكەوە لەتی بكەین‌و، بەكورتی، تێری‌و برسیەتی‌و ژیان‌و مردنمان پێكەوە بێت.

ئیدی بەهیوای ئەوەی كەوەك هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەرمان ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ ڕووتی‌و نەداری‌و برسیەتی‌و سەرماو گەرماو مەینەتی نەتوانێ كارمان تێ بكات‌و، پشتمان پێ لەجیهادو خەبات بكات، نەك وەك: بەنی ئسرائیلی‌یەكان، كە لە بیابانی سینادا خۆیان لەژیان‌و گوزەرانی سادەو كەم مەسرەف دا ڕانەگرت‌و پەلپ‌و بیانووی زۆری جۆراوجۆریان بەمووسا (علیة الصلاة والسلام) گرت‌و، سەرەنجام دووچاری ژیانی سەرگەردانی‌و زەبوونی بوون.

خوا بمانگێڕێ لەوانەی كەبەدەم بانگەوازەكەیەوە دەچن‌و بۆ ئایین‌و بەرنامەكەی گەردن كەچن.

والسلام علینا وعلی عباد الله الصالحین

## پێش خوا حافیزی

چاپکردنی ئەم کتێبەی جەنابی مامۆستا عەلی لەم ئانو ساتەدا سەلمێنەری ئەو راستییەیە کە لەسەردەمی شاخو خەباتی پێشمەرگانەدا دژی رژێمی بەعسی عەفلەقی ئیسلامییەکانی کوردستان دیدوبۆچونیان چی بووە بەرامبەر ئەو رژێمەو بەتایبەتر جەنابی مامۆستا لەئانو ساتەکانی بێ ئومێدی خەڵکی کوردو چەپۆکە دڕندانەکەی رژێمی بەعسی (کیمیاباران و بەناو ئەنفال) زەبرو زەنگەکانی تری دا بەرامبەر گەلەکەمان، کە لەساڵی (١٩٩٠) دا عافواتی داو خەڵك پۆل پۆل دەهاتنەوە شۆڕشیان بەتاڵ ئەکردو نائومێدیو یەئسو تەسلیم بونیان ئاشکرا دەکردو لەکەناڵەکانی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەوە ستایشی رژێمیان دەکردو ئەو لێبوردنە گشتییەیان بەمیهرەبانی (سەرۆکی فەرماندە) و رژێمەکەی ناودەبردو ئێستاش هەندێ رۆژنامەی رووزەردی ئەوکاتە شاهیدی ئەو راستییەن، بەڵام بزوتنەوەی ئیسلامی ئەوکاتە کە کۆمەڵی ئیسلامی میراتگری سەروەرییەکانیو درێژەپێدەری کاروانەکەیەتی، هێندە نەبوو دەستیان لەشەڕەکانی رەمکانو قەندیل بوو بووەو داستانی گەورەی گورچك بڕیان بەخوێنی پێشمەرگەکانی هێزی حەمزە نەخشاندبوو و ئاوارەو بێ خانەو لانەو هەژاریش لەهەموو کەس زیاتر تەنگی پێ هەڵچنیبونو لەگەڵ ئەوانەشدا ئازایانە کەوتنە خۆو بڕیاری خۆ بەدەستەوەدانو تەسلیم بوونەوەیان نەداو لەچاو حیزبو لایەنە لائیكو چەپەکانی ئەوکاتەدا بەپەنجەی دەست خەڵك تەسلیم بووەو گەڕایەوە خزمەتی سەربازیو ژێر نیری طاغوتی بەعسو

مامۆستا عەلی باپیریش ئەم نامیلکەیەی بۆ بەرچاو روونی و روونکردنەوەی حوکمی شەرع نوسی لەو کاتەدا، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئێستا پاداشت بۆ خەڵکانی تێکۆشەرو پێشمەرگەی ئیسلام و کورد پەروەرو خوبەدەستەوە نەدەرو دژە سازش لەگەڵ عەفلەقییەکاندا لەلایەن دۆستانی دوێنێی سەدامەوە بەزیندان و ڕفاندن درایەوەو بەناحەق لەسەردان و میواندارییەکی فێلاویدا جەنابی مامۆستاو هاوەڵەکانی لەرێگای هاوینەهەواری دوکان لەلایەن ئەمریکای هاوپەیمانی کوردەوە بەفرۆکە دەورە دراو بەرەو زیندانی ئینفرادی راپێچ کرا؛ بەڵام وەك وتویانە (ئەوی حسابی پاکە - لەموحاسەبە بێ باکە) مامۆستای خاوەن مێژوو پەرێزپاك و مسوڵمان و هەق پەروەر دوای نزیکەی (٢٢) مانگ لەسایەی فەزڵی خواوە سەرفرازانە لەو قوتابخانە یوسفی یەدا بەنمرەی بەرز بەرندە بوو.

ئەم نامیلکەیەش وەك گەواهییەکی مێژوویییە بۆ مامۆستاو ئیسلامییەکانی کوردستان تا خوێنەرانی کوردزبان، ئاگادارییەکیان هەبێ و لێی بەهرەمەند بن.



کاوە پێنجوێنی

٢٠٠٥/٥/١

